# ١٦٣٠ ووشه له په‌روه‌رده‌كردندا

**خالد عبدالله الديهان**



وه‌رگێڕانی
ده‌شتی فهمی

2022

ناوی کتێب : ١٦٣٠ ووشه له پەروەردەکردندا

نووسینی : خالد الديهان

بابەت : منداڵان

وەرگێڕان له عەرەبیەوە : دەشتی فهمی

ساڵ : ٢٠٢٢

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

" تۆ ببە بەو کەسەی کاتێك خەڵك دەتبینن      دەڵێن هێشتا دونیا خێری تێدا ماوە "

خوا لێی خۆش بێت ( حمد صالح العلیان )

# پێشەکی

لە ژیاندا زۆر کەسی گرنگ و کاریگەرم بینیوە کە سور بووم لەسەر ئەوەی  وورد ببمەوە لەسەر لایەنێکی دیاریکراوی ژیانیان، ئەویش ئەوەیە کە  ئاخۆ ئەم کەسە کاریگەرانە چۆن هەڵسوکەوتیان کردووە لەگەڵ منداڵەکانیاندا ؟

بگرە دەستم کرد بە نووسینەوەی کۆمەڵێك تێبینی بۆ ئەوەی ئەو خاڵانە بسەلمێنم کە بوونەتە هۆی سەرنجڕاکێشانم کە ئەوان وەك ئامراز و شێوازی پەروەردەکردن بەکاریان هێناوە لە هەڵسوکەتکردنیان لەگەڵ منداڵەکانیاندا.

دوای پێداچوونەوە و دڵنیا بوونەوە لە کاریگەریەکەی, کارم لەسەر ڕیزکردنیان کرد. وە بە فەزڵی خودا توانیم ووردی بکەمەوە لە چەند خاڵێکی سادە و ساکار و بیکەمە ١٠٠ بنەما و یاسا بۆ باوان کە زۆرترین کاریگەریان هەیە.

خوای گەورە ئەم کارە بە نیەتێکی صاف و دڵسۆزیەوەم لێ وەربگرێ.

# ١٠٠ یاسای پێشنیارکراو بۆ باوان لە پەروەردەکردنی منداڵاندا

## ١. ئارامی :

یاسای یەکەم بریتیە لە یاسای ژمارە ١٠٠. بەهۆی بایەخ و کاریگەریە ئەرێنیەکانیەوە بەو یاسایە دەستم پێکرد :

وا لە منداڵەکەت بکە هەست بە ئارامی بکات. وە لەو ڕەفتارانەی کە ئەم هەستە قووڵەی پێ دەبەخشێت ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە ڕۆژی جارێك منداڵەکەت لەباوەش بگری، ئەگەر زیاتریش بێت ئەوا زیاتر هەست بە ئارامی دەکات. ئەم کارە لەگەڵ هەر منداڵێکیتریش ئەنجام بدە کە دەیناسی.

## ٢.خۆشەویست کردنی ڕەفتار:

بۆ ئەوەی ڕەفتاری ئەرێنی لەلای منداڵەکەت خۆشەویست بکەی، چاودێری بکە. لە کاتێکدا کە کارێکی باشی کرد دەستخۆشی لێ بکە لەبەردەم خەڵکیدا. وە لەسەر ئەو ڕەفتارە ئەرێنیەی کە کردوویەتی لای خەڵك باسی بکە.

## ٣.گوێگرتن لە منداڵان :

قسە بە منداڵەکانت مەبڕە لەکاتێکدا کە قسەت بۆ دەکات، گوێی لێ بگرە و لە قسەکانیان ڕابمێنە، با هەر یەکێکیان باسی خۆی بکات و چی دەڵێ با بیڵێ. ئەم کارە وای لێدەکات هەستی متمانە بەخۆبوونی زیاتر بکات.

## ٤.ترس و تۆقاندن :

وریابە لە ترسی منداڵەکەت لێت. ببە بە هاوڕێی، ببە بە ڕاوێژکاری، لە ڕێگای یاری کردنەوە بۆخۆتی ڕابکێشە. ئایا دەزانی ڕێژەیەکی زۆری ئەو منداڵانەی دەترسن پەنا بۆ درۆ کردن دەبەن بۆ پارێزگاری کردن لە خۆیان؟

## ٥.خستنەڕووی بژاردەی جۆراوجۆر :

هەوڵبدە بژاردەی جۆراوجۆر پێشکەش بە منداڵەکانت بکەی. هەلی زیاتریان بۆ بڕەخسێنە، یارمەتیان بدە بۆ بڕیاردانیان لەو شتانەی دەیانەوێت. با لە بڕیارەکانیانەوە فێربن.

## ٦.خەڵکانیتر سەرچاوەن بۆ فێربوون :

خاوەن ئەزموونانێکی زۆر هەن لە دەوروبەرماندا. سوودیان لێ وەربگرە و بزانە ستراتیژی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان چۆنە.

## ٧.سزا :

منداڵەکەت هەرچییەکی کرد لە ڕووخساری مەدە. لە کارە لاوەکی و نافەرمیەکاندا پەنا بۆ سزا و پاداشت ببە نەك کارە سەرەکیەکانی وەکو ( خواردن، خواردنەوە، جل وبەرگ و نووستن..هتد). باشتریشە کە بزانێت هۆکاری سزادان پەیوەستە بە ڕەفتارەکانیەوە، وە ئەو بڕیارانەی دەیدات هۆکارن بۆ پاداشت و سزا و کەوتن و سەرکەوتنی خۆی.

## ٨. تۆ لە منداڵەکەت بە ئەزموونتری :

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە تۆ چ باوك بیت یان دایك، لە منداڵەکەت وشیارتری. منداڵ ئەو شتانە نابینێت کە باوانی دەیبینن, وەك باوانیشیان ئەزموونی پێویستیان نیە. لەبەر ئەوە پێویستە بەگوێرەی ئەزموون و وشیاری و زانینی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. چونکە ئەویش بەپێی ئەو شتانەی کە پێی دەوترێ و بەپێی کورتەی زانیاریەکان مامەڵە دەکات.

## ٩.پشتگیری :

خەونەکانی منداڵ هەرچییەك بوون بە گاڵتەیان مەزانە، هەرچۆنێك بوو بەڕاستی بزانە. باوکە کاریگەرەکان کار لەسەر بەدەستهێنانی خەونەکانی منداڵانیان دەکەن.

## ١٠.پێشکەش کردنی خۆشەویستی :

بەخۆشەویستیەوە ڕۆژەکەت دەست پێبکە لەگەڵ منداڵەکەت و بە خۆشەویستیش کۆتایی پێ بهێنە.

## ١١.نزا و پاڕانەوە :

لەکاتی نزا کردندا بۆ دایك و باوکت، نزای بەرەکەت بۆ ئەمانیش بکە.

## ١٢.گرنگیدان بە فێرکردنی منداڵان :

زۆر بە ووردیەوە قوتابخانەی منداڵە بچووکەکەت هەڵبژێرە، با ئەویش بەشدار بێت لەو هەڵبژاردنەدا.

## ١٣.دڵخۆش بوون لە کاتی دەستکەوتەکاندا :

ئەگەر منداڵەکەت دەستکەوتێکی بەدەست هێنا تۆش دڵخۆشبە بەو دەستکەوتە، ئاهەنگێکی بۆ ساز بکە کە گوزارشت لەو دڵخۆشیە بکات ئەگەر لە ماڵەوەش بێت.

## ١٤.وەبەرهێنانی پێگەیشتنی :

ڕێگا بە منداڵەکەت بدە کاتی خۆی وەرگرێ بۆ ئەوەی گەشە بکات، با سوود لە زانیاریەکانی چواردەوری خۆی وەربگرێ و هەست بەم پێگەیشتنە بکات.

## ١٥. سەرکۆنەکردنی زۆر، کەسێتی لاواز دەکات:

سەرکۆنەکردن کەم بکەوە، لەبری ئەوە بیگۆڕە بە ئاڕاستەکردنێکی زیرەکی ئەرێنیانە.

## ١٦.پێشەنگێکی باش :

هەمیشە لەبیرت بێت کە باوك و دایك نزیکترین پێشەنگن. بەرچاوترین قوتابخانەن بۆ منداڵان.

## ١٧. ئەوەی لە منداڵەکەتدا دەیبینی لە تۆدایە :

لەگەڵ خۆت و منداڵەکەتدا ئەوە بکە کە خوازیاری بەرانبەرت ئەنجامی بدات، سەرەتا خۆت دەست بکە بە ئەنجامدانی ئەو خوو و ڕەوشتانە کە منداڵەکەت دەبات بەرەو ئەنجامدانی.

## ١٨.کەسایەتی کۆمەڵایەتی:

بەسەربەرزیەوە کوڕ و کچەکانت ببە بۆ بۆنە کۆمەڵایەتیەکان یان بۆ پیاسەکردن لەگەڵ هاوڕێیان. تاکو لە تۆوە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ کۆمەڵگا فێربن و بەربەستی (ترس لە گەورەکان)یان لەلا بشکێت.

## ١٩.نهێنیە تایبەتیەکان :

با نهێنی هاوبەش لەنێوان خۆت و منداڵەکانتدا هەبێت بۆ نوێکردنەوەی متمانە بە یەکتری و ڕاهاتنیان لەسەر نهێنی پارێزی.

## ٢٠.پلانی خودی :

منداڵەکەت فێر بکە چۆن پلان بۆ ئامانجەکانی دابنێت.

## ٢١. بەهرە کەسێتیەکان :

هەوڵبدە منداڵەکەت فێری (مەلەوانی، تیرهاوێژی و ئەسپسواری) بکەیت. چونکە لە یەکەمیاندا پشت بەخۆ بەستنی تێدایە و لە دووەمیان وردبوونەوە و لە سێیەمیان ترس شکاندنی تێدایە. هەروەك لە عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕنەوە خوای لێ ڕازی بێت کە فەرموویەتی ( منداڵەکانتان فێری تیرهاوێژی، مەلەوانی و ئەسپسواری بکەن).

## ٢٢. بەرپرسیاریەتی :

هەموو دایك و باوکێك بەرپرسیارن لە منداڵەکانیان. هەروەك پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( ئایا هەمووتان شوان نین و بەرپرس نین لەوەی ژێر دەستتان؟ )

(( دەسەلاّتدار شوانە و بەرپرسە لە ژێردەستەکەی، پیاویش شوانە بەسەر خێزانەکەی و ئەوەی لەژێر دەستیەتی، خزمەتکاریش شوانە بەسەر ماڵی گەورەکەی و بەرپرسە لێی، ئافرەتیش شوان و بەرپرسیارە بەسەر ماڵی مێردەکەی و منداڵەکانی، پیاویش لە ماڵی باوکی بەرپرسە. ئایا هەمووتان شوان و بەرپرس نین لەوەی ژێر دەستتان ؟ ))

## ٢٣. ئازادی هەڵبژاردن :

ئەوە بزانە کە ئەوە تۆی بڕیار و بژاردە و ئامانجەکانت دروست دەکەیت نەك کەسێکیتر. کەواتە ئەو تێگەیشتنەش فێری منداڵەکانت بکە.

## ٢٤. ڕاهێنان کردن بۆ گوێگرتن لە ڕای یەکتر :

قبوڵ کردنی تێڕوانینەکان و ڕای خەڵکانیتر شتێکی جوانە، لەوەش جوانتر هەڵبژاردنی ئەو شتەیە کە داوای دەکەیت. بۆیە منداڵەکەت فێری ئەم کرانەوە و قبوڵ کردنە بکە، ئەم کارامەیەش زۆر پێویستی بە ئارام گرتن هەیە و دەبێ زۆریش باس بکرێت.

## ٢٥.قسەی نەرێنی :

ئەم گوزارشتانە بە منداڵەکانت مەڵێ ( تۆ گەمژەی ، هەستە نوێژ بکە ئەگەرنا دەچیتە جەهەننەم، لێت دەدەم...هتد). ئەم جۆرە قسانە کەسایەتی ئەوان لە ناوەوە دەکوژێ، ورەشیان دەڕوخێنێت. پێی بڵێ چی دەوێت با بیکات.

## ٢٦.هاوڕایی باوان بۆ وەڵامی منداڵەکان:

پێویستە هاوسەران هاوڕابن لەو قسانەی بە منداڵەکانیان دەڵێن. ناکرێ لە یەککاتدا یەکێکیان بە بەڵێ و ئەویتریش بە نەخێر وەڵام بداتەوە.

## ٢٧.ڕەوشتی جوان لەگەڵ منداڵان :

لەگەڵ منداڵەکانت بە ڕەوشتەوە قسە; بە میهرەبانی، بە نەرمی. بیرت نەچێ کە تۆ پێشەنگی یەکەمی ئەوانیت.

## ٢٨.گلەیی و باس کردنیان لای خەڵکی :

وریابە، دیسان وریابە; نەکەی گلەیی و لۆمەی منداڵەکەت بکەی لای کەسانیتر، بە تایبەت کە خۆیشی لەوێیە.

## ٢٩.ڕێکخستن:

منداڵەکەت لە بچووکیەوە ڕابهێنە لەسەر پاك ڕاگرتنی ژوورەکەی, بەلایەنی کەمەوە هەفتەی ڕۆژێك.

## ٣٠.هاوڕێیەتی :

ببە هاوڕێی منداڵەکانت، ببە برا گەرەیان; بۆ ئەوەی هەست بە هێمنی و ئارامی بکەن.

## ٣١.یاری کردن لەگەڵ منداڵ:

بێ ئەوەی هەست بە شەرم بکەی, یاری لەگەڵ منداڵەکانت بکە; بۆ نموونە ڕاکردن.

## ٣٢.مامەڵە کردنی ئەرێنی:

ئەگەر منداڵەکەت کەللەڕەقی نواند لەگەڵت; تۆ کەللەڕەقی مەکە لەگەڵی، با نەرم و نیانیەکە لەلای تۆوە بێت. چونکە ئەوان لە کاردانەوەکانمانەوە فێر دەبن.



## ٣٣.کاتی تایبەت لەگەڵیان:

سوربە لەسەر هەبوونی کاتی تایبەت بۆیان. کاتێك بێت کە تیایدا سەرقاڵیی تێدا نەبێ. ( لەم کاتەدا مۆبایلەکەت بخەرە لاوە).

## ٣٤.چاکە بەردەوام دەبێت :

لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکاندا, بانگخوازێك قسەیەکی جوانی کرد; ( خوای گەورە پاداشتی باوان دەداتەوە لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا). پاشان بەم فەرموودەیەی خوای گەورە گەواهیدا کە دەفەرمووێ :

**(والذين امنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان ألحقنا بهم ذريتهم)** واتا ( ئەو کەسانەی باوەڕیان هێنا و نەوەکانیشیان بە ئیمانەوە پەیڕەویان لێکردوون, زارۆ و نەوەکانیشیانمان پێگەیاندن لە بەهەشتدا).

زانایانی تەفسیر دەڵێن : **(ألحقنا بهم ذريتهم)** واتا کردەوەی نەوەکانیان پیێ دەگەیەنن.

ئەم ئایەتە مانایەکی زۆر قوڵ دەبەخشێ کە ئەویش ئەوەیە : هەر چاکەیەك کە ئەنجامی دەدەی; دەیبینیتەوە، تەنانەت لە دوای ژیانیشت.

## ٣٥.منداڵان ڕزق و ڕۆزین لەلایەن خوای گەورەوە :

هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت کە منداڵان; دیاری، ڕۆزی، پاڵپشتی و بەخششن لەلایەن خوای گەورەوە. جا لەبەر ئەوە نکوڵی لە هیچ کامیان مەکە.

## ٣٦.نوستن لەلای باوان:

با منداڵەکەت لە باوەشتدا بخەویێ ئەگەر مانگی ڕۆژێکیش بێت. هەر کاتێك حەزی نەکرد; ئەوا بزانە کە گەورە بووە.

## ٣٧.پێداچوونەوە:

یاسای ژمارە ١١ کە باسمان کرد, بە دەرگایەك لە دەرگاکانی بەرەکەت دادەنرێت بۆیان.

## ٣٨.ناسینی هاوڕێی منداڵەکانت :

گرنگی بە هاوڕێی منداڵەکانت بدە، لەسەر ئەوە سوربە کە ( بەهێز، زیرەك و جێی متمانە بن). پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمویێ ( **مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی، بۆیە با هەر یەکێکتان سەیر بکات و بزانێت هاوڕێیەتی کیێ دەکات).**

## ٣٩. دیاری :

ماوە ماوە دیاری پێشکەشی منداڵەکەت بکە، ئەوە وا لە منداڵەکەت دەکات هەست بە شادمانی بکات و گرِوتینی بۆ پەیدا ببیَ و مەوداکانی بۆ نزیك ببێتەوە. بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمویَ ( **دیاری بۆ یەکتر ببەن، خۆشەویستیتان لە نێواندا زیاد دەکات**).

## ٤٠. سەرەتا لە خۆتەوە دەست پێبکە :

سەرەتا خۆت بپارێزە، پاشان خزمانت. هەمیشە لەبیرت بێت کە یەکەمیان خۆت ئینجا کەس وکارت. چونکە ئەگەر تۆ لە بارودۆخیکی باش نەبیت ناتوانی یارمەتی ئەوانیتر بدەی. خوای گەورە دەفەرمویَ ( **ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی خەڵك و بەردە**).

## ٤١. سەرکۆنە کردن لە کاتی شکستەکاندا :

ئەگەر منداڵەکانتان شکستیان خوارد, لێیان ببورن، بە قسە و کرداریش پاڵپشتیان بکەن بەرەو سەرکەوتن.

## ٤٢. خودا بپارێزە ئەویش دەتپارێزێت :

ئەم ووشانە فێری منداڵەکانت بکە  کە پێغەمبەر (د.خ) فێری ئەو کەسەی دەکرد کە خۆشی دەویست. دەفەرمووێ (ئەی موعاز ;  سوێند بەخوا من تۆم خۆش دەویَ، پاشان ئامۆژگاریت دەکەم ئەی موعاز ; واز مەهێنە لەوەی کە لەدوای هەموو نوێژێك بڵێی; ( ئەی خودایە، یارمەتیم بدە لەسەر زیکر و یاد کردنت، لەسەر سوپاس کردنت، وە پەرستنت بەشێوەیەکی ڕێك و جوان).

## ٤٣. بەخشین:

بەخشین، دەرگایەکە لە دەرگاکانی خۆشەویستی. بۆیە هەندێك لە; کاتت، هەوڵت، سامان و بیرۆکەکانت ببەخشە بە منداڵەکانت و سوربە لەسەر ئەوەی باشترین بەخشین بێت. چونکە هەموو بەخشینێك وەبەرهێنانە بۆت.

## ٤٤ .بیخوێنەوە:

یاسای پێشوو بە وردی و سەرنجەوە بخوێنەوە. (یاسای ٤٣)

## ٤٥ .زمانی چاوەکان:

منداڵەکانمان زۆر بە جوانی لە زمانی چاوەکانمان تێدەگەن. بۆیە خۆشەویستیان پیٚ ببەخشن ئەگەر بە سەیرکردنێکیش بێت.

## ٤٦ .هەڵچوون:

توڕە مەبە، توڕە مەبە، توڕە مەبە.

## ٤٧ .گرنگیپێدانی نەرێنی:

لەگەڵ هەموو ئەو یاسایانەی پێشوو کە باسمان کردن، زۆریش گرنگە کە لە ڕادەی پێویست گرنگی زیاتر بە منداڵەکانمان نەدەین. چونکە زێدە گرنگیدان, جۆرێکە لە پەروەردەکردنی نەرێنی.

## ٤٨ .نرخاندنی کات:

منداڵەکانت فێری ڕێز گرتن لە کات بکە، بەوەی ببیتە نموونەی ڕێز گرتن بۆ کاتەکانیان.

## ٤٩ .ستایش کردن:

ستایشی منداڵەکەت بکە، دەبێتە هۆی زیاتر باوەڕ بەخۆبوونی, بیٚ ئەوەی لەخۆبایی بێت. بگرە بەهێزیشی دەکات.

## ٥٠.كاركردن لەناو كۆمەڵە:

یارمەتی منداڵەکەت بدە کە لەناو کۆمەڵەدا یاری بکات، بۆ ئەوەی بەقووڵی هەستی لایەنگری پەیدا بکات.

## ٥١.بەهرەی پەیوەندیەکانی لەلا بەهێز بکە:

منداڵەکەت بەشدار بکە لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان یان یانەکان. ئەمە یارمەتی دەدات گەشە بە پەیوەندیەکانی بدات لەگەڵ کەسانیتر.

## ٥٢.سەربەخۆیی:

وا لە منداڵەکەت بکە هەست بە سەربەستی بکات و بەتوانا بێت بۆ ئەنجامدانی کارەکان، لەڕێگەی یارمەتیدانی کەسانیترەوە.

## ٥٣.گوێگرتن:

ئەگەر دەتەوێ تێبگەی لە منداڵەکەت کە چی دەوێت، ئەوا باش گوێی بۆ بگرە.

## ٥٤.دیاریکردنی ئامانجی خێزان:

هەموو ئامانجەکانی خێزان دیاری بکە بە تەواوی.

## ٥٥.بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەت:

پەیوەندیت لەگەڵ خێزانەکەت زیاد بکە بە کارلێکردن و نزیك بوونەوە لێیان.

### ٥٦.زانست بە فێربوونە:

با منداڵەکانت پلان دابنێن بۆ گەشتی وشکانی و دەریایی یان کۆچ کردن.



### ٥٧.سەرەتا خێزان:

هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت کە خێزان شوێنی سەرەکی پەروەردە کردن و دەرخستنی پێشەنگەکانە.

### ٥٨.ناوی بانگ کردنەکان:

بە ئەرێنیەوە قسە لەگەڵ منداڵەکەت بکە، بۆ نموونە:

* فەرموو پاڵەوان. * قسە بکە پیاو. * گوێم لێتە بەتوانا. * تۆ ڕێکوپێکی.

* تۆ ناوازەی. * وەرە بلیمەت.

سەرەتا ناوەکەی بڵێ پاشان ناوەکەی بە سیفەتێك بنرخێنە وەکو( کاروانی ئازا، شەیمای جوان..هتد) یاخود ( شێرە، هەربژی، کوڕە پاکە خۆشەویستەکە، تۆ داهێنەری).

### ٥٩.ڕابردوو یەکسان نیە بە داهاتوو:

باوکانمان باش پەروەردەیان کردووین بەڵام لەبیرت بێت کە پەروەردەی ڕابردوو بەس نیە بۆ پەروەردەکردنی نەوەی ئێستا.

### ٦٠.نەووتراو, باشترە لە ووتراو:

پەیوەندی, بەبێ دەربڕین گرنگترە لە پەیوەندی بە دەربڕین. وەکو پەیوەندی بینین، دەست بەسەردا هێنان، دەست لە شان دان، ماچ کردن، دەربڕینە ئەرێنیەکانی ڕووخسار.

هەر یەکێك لەم ئامرازە بێدەنگانە گرنگی و کاریگەری خۆی هەیە.

### ٦١.بوونی ناڕەخەتیەکان کەسێتی بەهێز دەکەن:

هەموو ناڕەحەتیەکانی منداڵەکانت لامەبە کە ڕووبەڕوویان دەبنەوە، بەڵکو هانیان بدە خۆیان ڕووبەڕوویان ببنەوە; لە ژیاندا فێر دەبن کە ناڕەحەتیەکان, وانەیەکی باشە بۆیان. بۆیە بێبەشیان مەکەن لە سوودی ئەم وانانە.

### ٦٢.نموونەیی:

مەبە باوکێکی نموونەیی، ئەوەی لەسەرتە تەنها ئەوەیە کە باشترین شت کە هەتە پێشکەشی منداڵەکانت بکەی.

### ٦٣. هەموو شتێك پڕوپوچە:

فێری هونەری چاوپۆشینیان بکە لە شتە پڕوپوچەکان. وەك دەڵێن هەموو شتێك پڕوپوچە.

### ٦٤.لە پێغەمبەرەوە (د.خ) فێربە :

دانایی لە باشترین مامۆستاوە فێربە کە پێغەمبەرە (د.خ).

جارێکیان نوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد، لە یەکێك لە ڕکاعەتەکاندا سوجدەکەی زۆری خایاند، هاوڕێکانی وایانزانی مردووە. کاتێك نوێژەکە تەواو بوو بینیان یەکێك لە نەوەکانی لەتەنیشتیەتی. پێیانی فەرموو:

**لەوانەیە لە درێژی سوجدەکەم سەرتان سوڕمابێ. پاشان هۆکارەکەی ڕوون کردەوە و ووتی: ئەم کوڕەم هاتبووە سەر پشتم، حەزم نەدەکرد پەلەی لێ بکەم.**

**ئەم وانە پێغەمبەرانەیە, بەسوودە بۆ پەیوەندی لەگەڵ منداڵان. بۆ ئارام گرتن باشە لەگەڵیان، بۆ سنگ فراوانی باشە، بۆ دڵفراوانی. چونکە ئەوەی ئێمە دەیزانین ئەوان نایزانن. باشتر وایە کە گۆڕانکاریەکان لەناکاو نەبێت.**

**هەمیشە یەکێك لە خووە نەرێنیەکان هەڵبژێرە لە پەروەردە کردندا ئینجا دەست بەکاربە بۆ گۆڕینی. وەك ئەوەی کە نامەیەکی ئاگادارکردنەوەی ڕۆژانە دابنێی بۆ تەواو کردنی ئەم ئەرکە.**

## ٦٥.خولەکانی ڕاهێنان:

**لەپێناو فێربوونی هونەرێکی تازەدا سوربە لەسەر ئامادەبوونت لە خولە ڕاهێنانیەکانی تایبەت بە پەروەردەی منداڵان.**

## ٦٦.قسەکردن بە زمانی ئەوان:

**با ئەوەت لەلا ڕوون بێت کە شێوازی قسەکردنی منداڵان و هەرزەکاران جیاوازە لە شێوازی قسەکردنی گەورەکان.**

## ٦٧.دابەشکردنی ئامانجەکان:

**ئامانجەکانی ڕۆژانە، مانگانە و ساڵانەی منداڵەکانت بنووسە. با چێژ وەرگرن لە ئەنجامدانیان.**

## ٦٨.بەرنامەی ئایندە:

لەوانەیە ئەو ڕێگەی منداڵەکەت دەیگرێتەبەر ببێتە بەرنامەی داهاتووی. بۆیە زیرەکبە لەوەی پێی بگەیەنیت.

## ٦٩.ڕوونکردنەوەی بەهانە:

کاتێك منداڵەکەت چەند شتێك ڕەت دەکاتەوە کە داوای دەکەیت, چەند بەهانەیەکی پیێ بدە کە لەگەڵ ئەقڵی ئەودا بگونجێت.

## ٧٠.ترسی کۆمەڵایەتی:

واز لە منداڵەکەت بێنە با لەبەردەم خەڵکانیتردا بدوێ، بەمە ترسی ناو کۆمەڵی دەشکێت.

## ٧١.پشوودان:

ماوە ماوە چالاکیت تازە بکەوە و لە مانگێکدا بەلایەنی کەمەوە ڕۆژێك پشوو وەربگرە دوور لە خێزانەکەت.

## ٧٢.پێغەمبەر (د.خ) چی بە ( اقرع بن حابس ) فەرموو :

پێغەمبەر (د.خ) ماچی (حەسەنی کوڕی عەلی) کرد. لەوکاتەدا کە (**اقرع بن حابس التمیمی**) لەلای دانیشتبوو ووتی: من ١٠ کوڕم هەیە کە یەکێکانم ماچ نەکردووە. **پێغەمبەر** (د.خ) سەیری کرد و پاشان ووتی( **کەسێك ڕەحم بە کەسێك نەکات ڕەحمی پیێ ناکرێ** ).

### ٧٣.درۆ کردن:

کاتێك منداڵەکەت درۆ دەکات، بزانە کە هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە.

### ٧٤. بەزەیی و ڕێزگرتن :

منداڵە گەورەکە فێربکە بەزەیی بە بچووکەکەدا بێتەوە. وەهەروەها منداڵە بچووکەکەش فێربکە ڕێز لە منداڵە گەورەکە بگرێت. ئەم تێگەیشتنە وادەکات ڕێز و پێزانین ببێتە بەرنامەی ژیانی.

### ٧٥.نزیککردنەوەی مەودا بە یاریکردن:

لەگەڵ منداڵە بچووکەکەت یاری بکە و لەگەڵ هەرزەکارەکە ڕاستگۆبە و پاڵپشتبە بۆ پێگەیشتووەکەش.

### ٧٦.لە مانای خۆشەویستی قووڵ بەرەوە:

خۆشەویستی, هەموو کێشەکان لادەبات. منداڵەکانت بە خۆشەویستی ڕاستەقینە دابپۆشە جا چ بە ووشە بێ چ بە کردار.

### ٧٧.دڵرەقی، فێرکردن و چارەسەرە:

هەندێك جار دڵرەقی نیشان بدە. توندبوون, وانەیە.

با منداڵەکەت هەمیشە لەسەر دەستتان نەبێ چونکە ژیان چاکە و خراپەی تێدایە. با ئەوە باش فێربێت.

### ٧٨.گۆڕەپانی یەکەم:

ماڵ، یەکەم گۆڕەپانی فێربوونە. منداڵەکەتی تێدا تاقی بکەوە.

## ٧٩.ستایشی منداڵەکان:

ئەو سیفەتەی لە منداڵەکەتت دەوێ لەبەردەم هەمووواندا باسی بکە.

## ٨٠.خۆشەویستی هێزە:

یاسای ژمارە ٧٦ت بیر نەچێ کە بنەمای بەلاڕێدانەچوونی منداڵانە.

## ٨١.لادان:

هۆکارەکانی لادانی منداڵان ٣ شتن:

١.گوێ نەگرتن بۆیان لەگەڵ گفتوگۆ لەگەڵ نەکردنیان.

٢.هەوڵنەدان بۆ فێرکردن و خواپەرستیان.

٣.هاوڕێیەتی. پێویستە دایکان و باوکان ببنە هاوڕێی یەکەمی منداڵەکانیان.

## ٨٢.فێرکردنی تەندروستی:

هەموو مانگێك هەفتەیەکی تەندروستانە لەگەڵ خێزانەکەت ئەنجام بدە.

## ٨٣.سەرنج خستنە سەر ئەرێنی نەك نەرێنی:

بیرت نەچێ هەر شتێك سەرنجی بخەیتە سەری گەورە دەبێت و بەهەمان شێوەی ئەو بڵاو دەبێتەوە. بۆیە سەرنج مەخەرە سەر ئەو شتەی کە ناتەوێ. نەرێنی وەلا بنێ و سەرنج بخەرە سەر ئەرێنی.

### ٨٤.زوو خەوتن :

منداڵەکانتان فێر بکەن زوو بخەون تاکو تەندروستی و چالاکیان بپارێزن.

### ٨٥.پرسیار لەخۆت بکە:

چیم لە منداڵەکانم دەوێ؟ ئەی منداڵەکانم چیان لێم دەوێ؟

وەڵامەکەت دەبێتە ئامانجی داواکراو. بۆیە هەوڵی بەدەستهێنانی بدە.

### ٨٦.چۆنیەتی گرنگە نەك چەندێتی:

لەبیرت نەچێ کە پەروەردە, گرنگترە لە زیادکردنی ژمارە. هەندێك خەڵك بەتایبەتی لە نیشتمانی عەرەبیدا گرنگی بە زۆری ژمارەی منداڵ دەدەن بەبێ ئەوەی بیر لە چاودێری و پەروەردە کردنیان بکەنەوە. باوکانی جیاواز ئەوانەن کە دەگەڕێن بەدوای چۆنیەتی پەروەردە کردندا نەك تەنیا زۆرکردنی ژمارەکان.

### ٨٧.بەخشین کارامەییە:

وا لە منداڵەکانت بکە یارمەتی هەژاران بدەن، چەمکی چاکە و بەخشین و دەستگیرۆییان تێدا بڕوێنن.

### ٨٨.فیلمەکان زمانی سەردەمن :

لەگەڵ منداڵەکانت سەیری فیلمی جۆش وخرۆش بکە کە فێری ئازایەتی دەکەن، یارمەتیشیان بدە لە جێبەجێ کردنی ئەم مانایە.

## ٨٩.نوێژی بەیانی:

**کاتێك منداڵەکانت لە بچووکیەوە نوێژی بەیانیان بە کۆمەڵ پاراست و بەردەوام بوون لەسەری, لە گەورەییشدا بە زەحمەت وازی لێدێنن.**

## ٩٠. سێ کارامەیی:

**ئەو کارامەییانە فێری منداڵەکەت بکە کە وا لە منداڵەکەت دەکەن لەناو کۆمەڵدا بەهێز بژین; گرنگترینیان هونەری بەدەستهێنانی پەیوەندیەکان و پلاندانان بۆ ئامانجەکان و باوەڕ بوونە بە خودای گەورە.**

**ئەگەر منداڵەکەت بچووك بوو; ئەو پرسیارانەی لێبکە کە هەستەکانی بەرەو ئەو کارامەییانە دەکرێنەوە. بۆ نموونە:**

**لە پەیوەندیەکاندا ; (چۆن هاوڕێ پەیدا دەکەیت؟ چ یاریەکی لەگەڵ دەکەیت؟ سیفاتە دیارەکانیان چین ؟)**

**لە پلاندانانەدا ; ( ئەمڕۆ دەتەوێ چی بکەی؟)**

**وە لە باوەڕبوون بە خودا; خۆشەویستی و بەخشینەکانی خودایان بۆ ڕوون بکەوە لەگەڵ نیعمەتەکانی. وەهەروەها فێری چەمکی چاکەیان بکە.**

## ٩١.سیفاتە جوانەکان:

**مانای ناوی منداڵەکەت و لایەنە جوانەکانی ناوەکەی فێربکە لەگەڵ ئەو پاڵەوانانەی هەمان ناوی ئەویان هەیە.**

## ٩٢.ياسای سەرەکی :

ئەگەر لە منداڵیەوە ماندوو نەبیت لە پەروەردەکردنی منداڵەکەت، بە گەورەییش لێی ماندوو نابیت.

تۆ یەکەم ١٢ ساڵت لەلایە. ئەو بنەما سەرەکیانەی لێیانت دەوێ وەکو ئارامی، ئازادی، سەرکەوتن، ڕێز، تەندروستی، هێز، دین، بەختەوەری، دەوڵەمەندی و فێربوون و هەرچیەکی حەزت لێیە تیایاندا دروست بکە و دایبنێ.



## ٩٣.گۆڕان، کاتی بۆ نیە :

شتێك نیە بەناوی (کاتی بەسەرچوو)، بۆیە یاسای پێشتر بەمانای لەدەستچوونی کات نایەت. بەڵکو بەو مانایە دێت کە تۆ هەر لە سەرەتای تەمەنیانەوە گرنگی بە منداڵەکانت بدەی.

## ٩٤.بەهرە، نهێنی سەرکەوتنە:

بەهرەی منداڵەکەت بدۆزەرەوە. ئەگەر تێیدا نەبوو تۆ خۆت تێیدا دروستی بکە.

## ٩٥.ببە بە منداڵ بۆ منداڵەکەت:

باشترین پێشەنگ بۆ ئەم بابەتە پێغەمبەرە (د.خ).

بە منداڵێکی فەرموو : ئەی ( ئەبا عمیر) چۆلەکەکە چی کرد ؟

دانایی لەم ڕستەیەی پێشوو ببینەوە.

## ٩٦.ناسینی هاوڕێکانیان :

هاوڕێیانی منداڵەکەت لەماڵەکەتدا کۆ بکەوە و پشتگیری پەیوەندیە ئەرێنیەکانیان بکە.

## ٩٧.چاودێری کارتێکەر بکە :

چاودێری کاریگەری ( قوتابخانە، یانە و هاوڕێیان ) بکە لەسەر منداڵەکەت. وەهەروەها کار لەسەر گونجاوی گۆڕانکاریەکان بکە بۆ منداڵەکەت.

## ٩٨.بەراورد کردن :

بەراورد کردن، کەسێتی لاواز دەکات و ڕق و کینە و غیرە دروست دەکات. بۆیە منداڵەکەت بەراورد مەکە بە کەسانیتر.

## ٩٩.فێرکردن بە یاوەری :

ئەگەر بوارت بۆ ڕەخسا، منداڵەکەت ببە سەر کار. چونکە بەوە سەرنج دەداتە شتگەلێك كە بەلایەوە گرنگە و ئەزموونی زیاد دەکات.

## ١٠٠.یاسای ژمارە یەك :

یاسای ژمارە ١٠٠ بریتیە لە یاسای ژمارە ١.

ڕێگا بدە منداڵەکەت چیت پێ دەڵێ بەبێ پچڕاندن و هەڵسەنگاندنی. لەبیرت نەچێ کە ئەگەر تۆ گوێی بۆ نەگری ئەوا کەسانیتر گوێی بۆ دەگرن و ئاڕاستەی دەکەن.

